ئەفسەرێکی سوپای عێراقی لەگەڵ دوو ئوتومبێل سەرباز لە ڕێگەی خانەقینەوە دەچوونەوە بۆ موسڵ. ڕێگەمان دان و کارئاسانیمان بۆ کردن لە ڕێگەی سلێمانییەوە بڕۆنەوە بۆ موسڵ، بێگومان لەبەر تیرۆر و ترس لە شوێنی تر ئەو ڕێگەیەیان هەڵبژاردبوو.

نوێنەری حیزبەکانی کوردستان هاتن بۆ لامان و سەردانیان کردین، پشتیوانیی خۆیان بۆ هێزی پێشمەرگە نیشان دا. ئەم وەزعەش تاکو ڕۆژی ٢٠٠٨/٩/٤ هەروەک خۆیەتی. جولانی سەربازی عێراقی لە دەوری بازگەکانی نەقشبەندی دەستی پێکردبوو. داوایان لە پۆلیسی ئەوێ کردبوو چۆڵی بکەن. ئێمەش هەر لە تەماسدا بووین لەگەڵ هێزەکانی خۆمان. هەوڵیشمان دەدا تا دەکرێت شەڕ نەبێ. وتمان با تەقە لای ئێمەوە نەبێ، ئەگەر ئەوانیش دەستپێشخەر بوون، وەڵامی چاکیان دەدەینەوە. دکتۆر بەرهەم ساڵح لە بەغداوە تەلەفۆنی بۆ هەڤاڵ مەلا بەختیار کرد و وتی وەزیری بەرگری وتویەتی ئێمە هیچ بەرنامەمان نییە بچین بۆ بازگەی نەقشبەندی. پاش ئەوە وەزعەکە تۆزێک هێور بووەوە، بەڵام جێگەی بڕوا نەبوون. دەبوو ئێمە وریا بین. شەو دکتۆر خەسرەو گوڵ محەمەد بە تەلەفۆن وتی ئیحتیاتی خۆتان بکەن، نیازیان هەیە پەلاماری ئەو سنوورە بدەن تاکو ٩/٢٠، ئامادەگیی باش بکەن، ئەوان نیازیان باش نییە. ئەوەی لەسەر ئێمە بوو، هەموو هێزەکانی خۆمان ئاگادار کردەوە وریاتر بن لە جاران.

ڕۆژی ٢٠٠٨/٩/٥ سەعات ٨:٣٠ لەگەڵ هەڤاڵ مەلا بەختیار چووین بۆ کفری، لەوێش هەڤاڵ "مەردان چاوشین" لێپرسراوی مەڵبەند پێکەوە چووین بۆ جەبارە. زیاتر لە "٣٠٠" کەس لە کورد و عەرەب و تورکمان کۆبووینەوە.

ڕۆژی ٩/٥ سەعات سێ و نیو "عبدالمنعم" ئامرلیوای سەربازیی سوپای عێراق کە لە جەلەولا بوو لەگەڵ فەرماندەیەکی ئەمەریکی کە ناوی "کۆفی" بوو، هاتن بۆ لامان بۆ خانەقین. لەسەر وەزعی جەلەولا

قسەمان کرد، ئاگادارمان کردن بە هیچ شێوەیەک ڕێگەیان نادەین هەنگاوێک بێنە پێشەوە. ڕۆژی ٢٠٠٨/٩/٨ سەردانێکی سەنگەرەکانی "حەلوانم" کرد لای پردەکە. هەندێک ئامۆژگاریم کردن بۆ بەهێزکردنی سەنگەرەکانیان. هەمان ڕۆژ وەزیری بەرگریی عێراق "عەبدولقادر عبیدی" هات بۆ لای قائیمقامی خانەقین لە منذریە. لەگەڵی دانیشتبوو و وتبووی ئێمە نایەینە خانەقین. ئەو ئێمەی نەبینی، بەڵام ئێمە وردەکاریی هاتنەکەیمان زانی.

ڕۆژی دوایی لەگەڵ لیوا ئیسماعیل سەرحان چووم بۆ سەردانی جەبهەکانی پەڵکانە، لەگەڵ پێشمەرگەکان دانیشتم کە لیوای ٢٤ی لێبوو. زیاد خۆرانی ئامرلیوایان بوو. دوایی ئەوە ڕۆیشتین بۆ سەنگەرەکانی باخچە. پشتیوانیی خەڵکی و هەڤالان تەواو نابێ. زۆر دڵسۆز بوون بۆ هێزی پێشمەرگە.

ڕۆژی ٩/٩ جەمال حەکیم ئاغا و سەلاحەدین موهتەدی و جەلال سام ئاغا و عەمید هادی سوور و مامۆستا موحسین عەلی ئەکبەر و یوسف زۆزانی هاتن بۆ لامان، تا ماوەیەکی درەنگ لامان بوون بۆ هاودەنگی و پشتیوانی.

ڕۆژی ٢٠٠٨/٩/٢٠ ڕۆژی لەدایکبوونی دابانی کوڕم بوو. هەر بە تەلەفۆن پیرۆزبایم لە خۆی و باقیاتی ماڵەوەمان کرد.

بڕیار بوو کۆبوونەوەیەک ڕێک بخرێ لە نێوان ئێمە و نوێنەری وەزارەتی بەرگری عێراق. ئەمەریکییەکان کۆبوونەوەکەیان ڕێک خستبوو. سەرۆکی هەرێم بەڕێز مەسعود بارزانی منیان کردبوو بە سەرۆکی هەیئەتەکەی خۆمان. بڕیار بوو کۆبوونەوەکە لە بارەگای فڕۆکەخانەی کەرکووک بێ، کە ئەمەریکییەکان لەوێ بوون. ڕۆژی ٢٠٠٨/٩/٢٩ سەعات پێنج و نیو لەگەڵ لیوا ئیسماعیل سەرحان چووین بۆ هەولێر و لەگەڵ عەمید جەمال کە لە دهۆکەوە هاتبوو، یەکمان گرتەوە. سواری هالیکۆپتەریان کردین و چووین بۆ کەرکووک، لە

بارەگای سوپای ئەمەریکا دابەزیین، کۆبوونەوەی هاوبەش دەستی پێکرد.

وەفدی کوردی پێک هاتبوو لە (مستەفا چاوڕەش، لیوا ئیسماعیل سەرحان، عەمید جەمال). وەفدی سوپای عێراقیش پێک هاتبوون لە عەلی غیدان فەرماندەی هێزەکانی وشکانی و فەریق عەبدولکەریم عبیدی فەرماندەیی هێزەکانی دیالە، فەرماندەی فیرقەی موسڵ. لەلایەن ئەمەریکیەکانەوە چەند ئەفسەرێکی پلە بەرزی سوپا هاتبوون، لێپرسراوەکەیان "هایتلک" بوو، هەموو باسەکە لەسەر خانەقین بوو. دیار بوو عێراقییەکان واهاتبوون ڕازیمان بکەن ئێمە ئەوێ بەجێ بهێڵین، ئێمەش ئەوەی بیرمان لێنەدەکردەوە، چۆڵکردنی خانەقین بوو. لەگەڵ ئەوەی ئەمەریکییەکان ئێمەیان بە حەق دەزانی، بەڵام دڵی ئەوانیشیان لا مەبەست بوو. هەردوولا لەسەر هەڵوێستی خۆمانماینەوە، وتم خانەقین وڵاتی کوردستانە، ئێمە نەچووینەتە سەر خاکی کەس. ئێوە کێشەتان چییە و بۆ داوای چۆڵکردنی دەکەن؟ ئێمەین دژی تیرۆرین. خۆ لای ئێمە پارێزراوە، ئەو جێگەیانەی ئێوەی لێن، هەمیشە تەقینەوە و وێرانییە. بە هەرحاڵ، پاش دوو سەعات کۆبوونەوە چۆن هاتین، هەرواش گەڕاینەوە. بچوکترین نەرمیمان نەنواند بۆ کشانەوە لە خانەقین. لای ئەمەریکییەکان نان حازر کرابوو. لە دانیشتنی موجامەلاتدا هەر ئەو باسانە بوو، من وتم باشە پرسیارێکتان لێدەکەم: ئێوە سنووری کوردستان بە کوێ دەزانن؟ قسەیان نەکرد، وتیان تو بیڵێ. وتم من بیڵێم؟ وتیان بەڵێ. وتم من هەر لە منداڵییەوە کە زمانم پشکوتووە و چاوم کردۆتەوە، شاخی حەمرینم بە سنووری کوردستان زانیووە. هەر ئەوەنەبوو هەڵسنە سەر پێ، زۆر لایان قورس بوو. عەقڵیان قبوڵی ئەوەی نەدەکرد. وتم وایە و هەرواش دەمێنێتەوە. بۆ مێژوو عەمید جەمال و لیوا ئیسماعیل سەرحان شاهیدن. پاش نانخواردن سواری هالیکۆپتەریان کردین و هێنایننیانەوە بۆ هەولێر.

لەویش چاومان کەوت بە فەریق شیروان عەبدولڕەحمان. ئەوەی بۆی چووبووین باسمان کرد و بۆمان گێڕایەوە بۆ ئەوەی جەنابی سەرۆکی هەرێمی لێ ئاگادار بکاتەوە.

هەر ئەو ڕۆژەش کە لە هەولێر بووین، مام جەلال لە سەفەری دەرەوە گەڕایەوە. کاک مەسعود بارزانی و تارق هاشمی لە فڕۆکەخانە پێشوازییان لێکرد. منیش چووم و بەشدار بووم. دوای ئەوە گەڕامەوە بۆ سلیمانی و پاشان چوومەوە بۆ خانەقین. پاش گەڕانەوەی مام جەلال وردەوردە بەغدا هێور بۆوە. ئێمەش گەڕاینەوە بۆ جێگەی خۆمان. بەڵام هێزی باشمان لە خانەقین بەجێ هێشت و تاکو ئێستاش هەر بەردەوامین لەسەری. ئەم کێشەیە هەر ماوە و دەمێنێ. هەر حاکمێکی تریش بێتە سەر حوکم لە عێراق، تاکو خەڵکی کوردستان بە حەقی خۆی نەگات، واز ناهێنێت لە داوا ڕەواکەی. هەرچی حاکمی پێشوو و ئێستاش هەیە، چاویان هەڵنایەت داوای ڕەوای خەڵکی کورد جێبەجێ بکەن. هێشتا لەوە حاڵی نەبوون هەتا حەقی کورد جێبەجێ نەکرێ، هیچ کەسێک لە عێراق بە ئارامی ناژی و هیچ حاکمێک تەختەکەی ناپارێزێ و سەرکەوتوو نابێ. لە دوای شۆڕشی چواردەی گەلاوێژەوە زۆرمان بینی. لە پاش ڕووخانی حوکمی مەلیک فەیسەڵ ئارامی لە عێراقدا نەبووە، چونکی داوای خەڵکی کوردستانیان جێبەجێ نەکردووە، کوردیش شتێکی زیاتری لە حەقی خۆی داوا نەکردووە.

ڕۆژی شەممە ٢٠٠٨/١١/٨ نزاری سکرتێری هەڤاڵ مام جەلال لە بەغداوە تەلەفۆنی بۆ کردم و وتی مام جەلال داوای کردووە لەگەڵ مستەفای سەید قادر و هاشم مام عەلی ڕۆژی پێنجشەممە لە بەغدا سەردانی بکەن، وتم زۆر باشە. لەگەڵ هەڤاڵان خۆمان حازر کرد بۆ سەفەر، بەڵام ڕۆژی دووشەممە ١١/١٠ جارێکی هەڤاڵ نزار تەلەفونی کردەوە و وتی مەوعیدەکەی ڕۆژی پێنج شەممە بخەنە ڕۆژی شەممە، لەبەر ئەوەی مام جەلال کاری بۆ هاتۆتە پێشەوە، وتمان زۆر باشە.

ڕۆژی شەممە لە سلێمانییەوە چووین بۆ بەغدا، من و مستەفای سەید قادر و هاشم مام عەلی و مەحموود سەنگاوی، ئێوارەکەی هەریەکەمان بە جیا چاومان کەوت بە مام جەلال و خاڵە گرنگەکانی داینێ بۆ ئەوەی سبەینێ باسوخواسی لەسەر بکەین. ڕۆژی دوایی پاش نانخواردن کۆبوونەوەی لەگەڵ کردین. کۆمەڵێک قسە کران بۆ چاککردنی وەزعی پێشمەرگە و پێویستیی فەرماندەیی و ئامۆژگاریی کردین. لە کۆبوونەوەکەدا بڕیار درا "١٠٠" دۆلار بۆ پێشمەرگە زیاد بکرێ. شەویش هەر لە بەغدا لە میوانخانەکەی مام جەلال بووین. شەوی ١١/١٧ گەڕاینەوە بۆ سلێمانی، لە گەڕانەوەشدا هەڤاڵ حامدی حاجی خالدمان لەگەڵ بوو. هەندێک ڕاسپاردەی پێوتبووین دەربارەی هەندێک لە بارەگاکانمان لە سەرای سوبحان ئاغا، کە ئاڵوگۆڕ بە جێگەکەی بکرێ. لە گەڕانەوەماندا جێبەجێمان کرد. چونکی باشترین پێویستیەکانی هێزی پێشمەرگە و سەرۆکایەتیی ئەرکانمان لەوێ بوو، حسابی تایبەتمان بۆ کرد و گواستمانەوە، ناحەزان چاویان تێبڕیبوو زیانی پێبگەیەنن.

### خەستەخانەی پێشمەرگە

دکتۆر "ڕێکەوت حەمە ڕەشید" بوو بە سەرۆکی خەستەخانەی شۆڕش. من لەگەڵی چووم بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکە و لەوێش لەگەڵ کارمەندانی خەستەخانە بە دکتۆر و کەسانی تریشەوە بەشدارییان کرد. لەسەر گرنگیی نەخۆشخانەی شۆڕش و خزمەتکردنی. قسەم بۆ کردن.

ڕۆژی ٢٠٠٨/١١/٢٥ ئەمەریکیەکان هاتن بۆ لامان، دیڤید و سیار فەرماندەی جێبەجێکردنی ئاوەدانکردنەوە لە هەرێمی کوردستان. لەگەڵ هەڤاڵ مستەفای سەید قادر لەگەڵیان دانیشتین. لەسەر ئەو مەسەلانەی پەیوەندیی بە ئێمەوە هەبوو قسەمان کرد.

## وەفاتی عەلەڕەش

ڕۆژی ٢٠٠٨/١٢/٢٤ خۆم و مەحموود سەنگاوی و عارف ڕوشدی چووین بۆ دەربەندیخان بۆ بەشداری لە مەراسیمی ناشتنی "عەلەڕەش"دا کە بە نەخۆشی وەفاتی کردبوو. مام عەلەڕەش یەکێک بوو لە هاوڕێ کۆنەکانی شەستەکان. لە حیزبی شیوعیدا پێکەوە بووین لە دەرەوە. پیاوێکی نەبەز و سەرچڵ بوو. بە تەمەن لە من گەورەتر بوو، ئەو لە ساڵەکانی پەنجاکاندا بەشداریی جوڵانەوەی جوتیارانی کردبوو لە سنووری هۆرێن و شێخان. ئەو کاتە حیزبی شیوعیی عێراقی سەرپەرشتیی دەکرد. لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا پیاوێکی نەترس بوو، خەڵکی دێی "کوێرەک" بوو، هەر لەوێش بەخاکمان سپارد. زۆر لە برایانی تر هاتبوون، عومەر سەید عەلی و مەلا بەختیار بە ناوی یەکێتییەوە قسەیان لەسەری کرد و حەقی خۆیان دایە. عەلەڕەش هەر لە دروستبوونی کۆمەڵە و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە بەردەوام بوو. لە قەرەداغ کە من فەرماندەی هەرێمی ٥ بووم، ئەو لە کەرتی بەمۆ بوو، بەشداریی دەیان چالاکیی کردووە. کوڕێکی بە ناوی ئازاد شەهید بوو. ئەمیش لە ڕیزەکانی "حەمە فەرەج فەتاح"دا بوو، کە لە بناری بەمۆ دوو کەسی دیاری جوڵانەوەی جوتیاران بوون. حەمە فەرەج خەڵکی دێی بانی بی بوو لە بناری بەمۆ، دوو کوڕی قارەمانی لە شۆڕشدا شەهید بوون. لە هەردوو ڕۆژەکەدا چووم بۆ دەربەندیخان بۆ مەراسیمی پرسەکەی. لە ساڵی "١٩٦٨" لەگەڵ شەهید ئەکرەمی حەپسەی پووررزام ماوەی مانگێک زیاتر لەماڵی عەلەڕەش بووین. بە هۆی چالاکیمانەوە لەناو حیزبی شیوعی عێراقی قیادەی مەرکەزی لە دەستی دەسەڵات رامان کردبوو.

## لیژنەی جیاکردنەوەی حیزب و حکومەت

لەسەر ڕۆشنایی و بڕیاری مام جەلال لەناو یەکێتیدا چەند لیژنەیەکیان بۆ جیاکردنەوەی حیزب لە حکومەت دروست کرد. ئەمەش زۆر قسەی لەسەر کرا و زۆری ویست بۆ ئەوەی هەر کەسێک کاری خۆی جێبەجێ بکات. ئەو لیژنەیەی من لێی بەرپرسیاری بووم، لە پۆلیس و ئاسایش پێک هاتبوو و ئەندامەکانی بریتیبوون لە خوالێخۆشبوو موحسین بایز، ڕەهبەری سەید ئیبراهیم، عوسمان بانی مارانی، لیوا ئەحمەد موسا. ماوەی دوو سەعات لە بینای پۆلیسی هاتوچۆ کۆبووینەوە و لەسەر مەسەلەی جیاکردنەوە و پاکسازی و چاکسازی قسەمان کرد. پرسیار زۆر کرا و وەڵاممان دایەوە. ڕۆژی ٢٠٠٩/١/٣ سەعات دە لە لەگەڵ بەشی ئاسایش و بەشی پاسپۆرت و مانەوە بۆ هەمان مەبەست کۆبووینەوە. دواتریش لەگەڵ بەرگری و فریاکەوتن و پۆلیسی کارەبا کۆبووینەوە. ئەوەندەی پەیوەندیی بە لیژنەکەی ئێمەوە هەبوو وەک پۆلیس و ئاسایش، کاری خۆمان جێبەجێ کرد و دواڕاپۆرتمان لەسەر چاکسازی و جیاکردنەوەی حیزب و حکومەت تەسلیم بە مەکتەبی سیاسی کرد.

ڕۆژی ٢٠٠٩/١/٢٦ هەیئەتێکی وەزارەتی پێشمەرگە کە پێک هاتبوون لە برایانی پارتی (زەعیم عەلی، عەبدولڕەحمان بێشوکی، محەمەد قازی، ئازاد خۆشناو، عومەر عوسمان) هاتن و لەسەر یەکگرتنەوەی وەزارەتی پێشمەرگە و وەزعی کەرکووک کۆمەڵێک ڕاو بۆچوونمان باس کرد. لە بیروڕاکانماندا زۆر لە یەکەوە نزیک بووین. بارودۆخی ئەو کاتەی کوردستانیش ئەوەی دەویست. لەم کۆبوونەوەیەدا دکتۆر ڕێکەوت حەمەڕەشید، کە لێپرسراوی خەستەخانەی شۆڕش بوو، بەشدار بوو لەگەڵمان.

**وازهێنانی هەندێک لە هەڤاڵانی م.س**

دیارە یەکێتی لەگەڵ ئەو هەموو قۆناغەی پێیدا تێپەڕیووە و مێژوویییەکی زیاتر لە ٣٠ ساڵی هەیە، بێکێشە نەبووە. لە هەندێ قۆناغدا کێشەکان چارەسەر کراون، هەندێک جاریش کێشەکان لەسەر یەک کەڵەکە بوون و ماونەتەوە.

ڕۆژی ٢٠٠٩/٢/١٣ هەڤالان (عوسمان حاجی مەحموود و مستەفای سەید قادر و عومەری سەید عەلی و جەلال جەوهەر) وازیان لە یەکێتی هێنا. ئەمەش هەتا بڵێیت کاریگەر و ناخۆش بوو. ئێمە نیوەی تەمەنمان لە ڕۆژگارە ناخۆشەکاندا پێکەوە بووین. خۆ لە خۆوە وازیان نەهێناوە. منیش ڕۆژانە کە لە مەڵبەند دەبووم، دەیان و سەدان کادێر تەلەفۆنیان بۆ دەکردم و لەسەر وازهێنانی ئەو هەڤالانە پرسیاریان لێدەکردم. منیش بە هێمنی وەلامم دەدانەوە. ئەمەش جارێ پێشەکییەکەیەتی، با بزانین بەرەو کوێ دەڕوات. خۆشمان هەندێک لە هەڤالانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی قسەمان لەسەر ئەوە و دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەک کردبوو. باس هەر باسی وازهێنانی ئەو هەڤالانە بوو.

ڕۆژی دوایی چووم بۆ ماڵی کاک کۆسرەت، دەیان کادێر و ئەندامی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی لەوێ بوون. لەناویشیاندا هەڤالان (عەدنان موفتی و عیماد ئەحمەد و جەلال جەوهەر و مستەفای سەید قادر و عوسمان حاجی مەحموود). هەموو نیگەران بووین لەسەر ئەم وەزعەی هاتبووە پێشەوە. بڕیار بوو ئێوارە هەڤاڵ عوسمانی حاجی مەحموود بچێت بۆ لای مام جەلال بۆ بەغدا. ڕۆژی ٢٠٠٩/٢/١٥ چووم بۆ مەڵبەند. وەک ڕۆژانی تر نەبوو، هەڤاڵ مستەفای سەید قادر نەهاتبوو بۆ دەوام. یەکێک بوو لەو چوار هەڤاڵەی وازیان هێنابوو. منیش کۆبوونەوەیەکی کارگێڕی مەڵبەندم بەڕێوە برد و لەسەر ئەم وەزعەی ناو یەکێتی قسەم کرد. وتم سەرکەوتن و گرنگیی ئەم وەزعە ئەوەیە هەمووومان هەوڵ بدەین چارەسەرێکی بۆ بدۆزینەوە، یەکێتی

لاواز نەبێ و قسەی باش بکەین. ئەمەی ڕووی داوە، لە سەروو ئیرادەی ئێمەوە بووە و پرسیشمان پێنەکراوە. شەو بە تەلەفۆن لەگەڵ مام جەلال و دکتۆر بەرهەم و کاک کۆسرەت قسەم کرد. بەڕاستی وەزعێکی زۆر قورس بوو. کەسوکاری شەهیدان وتیان کوڕی خۆمان بۆ ئەوە بە کوشت نەدا تا وەزعی یەکێتی ئاوای لێبێت. وتیان لێتان قبوڵ ناکەین و دژتان خۆپیشاندان دەکەین. نەشماندەزانی ئەم دۆخە بە کوێ دەگات.

ڕۆژی ٢٠٠٩/٢/١٦ هەڤاڵ کۆسرەت و هەڤاڵ بەرهەم و مستەفای سەید قادر چوون بۆ بەغدا بۆ لای مام جەلال بۆ ئەوەی لە نزیکەوە قسەی لەگەڵ بکەن لەسەر وازهێنانی ئەو هەڤاڵانە، بەو هیوایەی ئەنجامێکی باشی هەبێت. منیش بە قەدەر حاڵی خۆم نیگەران بووم. ئەو کۆبوونەوانەی لە مەڵبەندی پێشمەرگە بەڕێوەم دەبرد، هەر قسەی باشم دەکرد، ڕێگەم نەدەدا کەس قسەی خراپ بکات و لەو دۆخەی هاتبووە پێشەوە، سوود وەرگرێ. پاش گەڕانەوەی کاک کۆسرەت دیار بوو لەسەر زۆر مەسەلە ڕێک کەوتبوون.

بڕیار بوو ڕۆژی ٢/١٩ دکتۆر بەرهەم و دکتۆر فوئاد مەعسوم لە بەغداوە بە نامەیەکی مام جەلالەوە بێنەوە بۆ لای کاک نەوشیروان. لەگەڵ ئەوەشدا دیار نەبوو ئەنجامەکە بە کوێ دەگات. وەزعی ناو یەکێتی پاش ئەو وازهێنانە گەورەیە مایەی دڵخۆشی نەبوو. خەم باڵی بەسەر هەمووواندا کێشابوو. ڕۆژانی دواتر مام جەلال بە سەفەرێک ڕۆیشت بۆ کۆریا. چاوەڕێ بووین بگەڕێتەوە و دۆخەکە بکەوێت بە لایەکدا.

## بڕیاردان لەسەر بەستنی کۆنگرەی سێ

ڕۆژی ٢٠٠٩/٤/٢١ لە کۆبوونەوەی مەکتەبی سیاسی بڕیار درا کۆنگرەی سێهەم لە مانگی شەشی ساڵی داهاتوودا ببەسترێ، واتە ٢٠١٠/٦/١ کە ساڵڕۆژی دامەزرانی یەکێتییە. بۆ ئەم مەبەستەش لە مەڵبەند کۆبوونەوەمان کرد و بە هەنگاوێکی باشمان زانی. دەبوو خۆمان حازر بکەین و ئەوەی دەکەوێتە سەرشانمان، جێبەجێی بکەین.

کاک ئاوات لە سکرتاریەتی هەڤاڵ مام جەلال تەلەفۆنی بۆ کردم و وتی سبەینێ سەعات دوانزەونیو لە دوکان لای مام جەلال بن، دیاریتان دەداتێ، کە تایبەتە بە پێشمەرگە کۆنەکان. ڕۆژی دوایی نزیکەی بیست کەس بووین لە لێپرسراوی پێشمەرگە دێرینەکان و ڕۆیشتین بۆ لای مام جەلال لە دوکان. پاش ئەوەی مام جەلال باسی ڕۆڵی هەریەکەمانی کرد، یەکی "دەمانچە"یەکی داینێ وەک ڕێزلێنان لە ماندووبوونمان.

## کۆبوونەوەی سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

ڕۆژی ٢٠٠٩/٥/٢٥ بە سەرپەرشتیی هەڤاڵ مام جەلال و جێگرەکان کۆبوونەوە کرا و پێداگیری لەسەر دوو خاڵ کرا: یەکێکیان مەسەلەی عێراق بوو و قسەی زۆر لەسەر کرا، دووەم لەسەر ئەو هەڤاڵانەی چووبوونە ناو گۆڕانەوە. لە کۆبوونەوەی سەرکردایەتی پاش گفتوگۆ بڕیار درا داوایان لێبکرێ بگەڕێنەوە ناو یەکێتی. ئەگەر نەگەڕانەوە، بەپێی پەیڕەوی ناوخۆ هەڵیانپەسێرن "تجمید"، دواتریش کۆنگرە بڕیار لە چارەنووسیان بدات.

لە ئەوروپا هەندێک لە هەڤاڵەکان بە ناوی (ڕەگ)ەوە بەیاننامەیەکیان دەرکرد و پشتیوانیی خۆیان بۆ برادەرانی گۆڕان دەربڕی. ئەوانەی کە لە کۆمیتە و یەکێتی وازدەهێنن، تەلەفزیۆنی KNN بۆیان بڵاو دەکاتەوە

که لەسەر بیروباوەڕی جیاواز ڕیزەکانی یەکێتییان بەجێ هێشتووە و وازیان هێناوە. ئەم وەزعەش ڕۆژانە بەردەوام بوو. هەندێک کەس لە مەڵبەندی ڕێکخستنی پێشمەرگە لەگەڵیان ڕۆیشتن. ئێمەش لای خۆمانەوە زۆر بە هەستیاری لەگەڵ ئەم وەزعە جولاینەوە، بەتایبەت من خۆم.

ڕۆژی ٥/٣٠ سەردانی کاک کۆسرەتم کرد، داوای لێکردم بچم بۆ پشدەر و بتوێن. وتی لەوێ هەڤاڵان بە قسەت دەکەن. وتم ئەمرێکم بۆ دەربکەن، خۆ لە خۆمەوە ناچم. ئەوەبوو مەکتەبی سیاسی بڕیارێکی بۆ دەرکردم.

## وەفاتی هەڤاڵ موحسین بایز

ڕۆژی ٢٠٠٩/٦/١١ قائمقامی ڕانیە عەلی حەمەد بەگ بە تەلەفۆن ئاگاداری کردم کە موحسین بایز بە هەڵە فیشەکی تاپڕی لە دەست دەرچووە بووە بە هۆی شەهیدبوونی خۆی. بەڕاستی هەواڵێکی ناخۆش بوو. هێنایانە سلێمانی بۆ پزیشکی دادوەری. دوایی لەگەڵ تەرمەکەی چووم بۆ ڕانیە. ڕۆژی دوایش هەڤاڵانی مەکتەبی سیاسی هاتن بۆ بەشداری لە بەخاکسپاردنی. من پێشەکی قسەم لەسەر خەبات و تێکۆشانی کرد. دواتر هەڤاڵ بەرهەم ساڵح و پاش ئەویش هەڤاڵانی تر قسەیان کرد. موحسین بایز تێکۆشەرێکی ماندوونەناسی یەکێتی نیشتمانی بوو، پیاوێکی مەرد و ئازا بوو، خەڵکی خۆشیان دەویست، لە خزمانی میرزا ڕۆستەمی بوو.

**دانانی دکتۆر فوئاد مەعسوم و خۆم**

لەسەر بڕیاری هەڤاڵ مام جەلال و مەکتەبی سیاسی من و دکتۆر فوئاد مەعسومیان دانا بۆ سەرپەرشتیی هەڵبژاردن لە سنووری پشدەرو بتوێن و کۆیە. منیش سەردانی دکتۆر فوئادم کرد لە ماڵەوە و بڕیارمان دا ڕۆژی سێشەممە بچین بۆ ڕانیە.

چووینە ڕانیە و لەوێ ئوتێل بتوێنمان گرت بۆ ئەو ماوەیەی کە لەوێین بۆ سەرپەرشتیی هەڵبژاردن و بارەگامان دانا. ئیتر کەوتینە خۆمان بۆ چاوپێکەوتنی خەڵکی و کەسایەتییەکان و کۆمیتەی حیزبییەکان، ناوبەناویش سەردانی قەڵادزە و جێگاکانی ترمان دەکرد. ئەوەندەی توانیمان و عەقڵمان بڕیی، لە سەردان و قسەکردن و چاوپێکەوتنی خەڵکی دریغیمان نەکرد بۆ سەرکەوتنی لیستی کوردستانی، لام وابێ کەسمان بێبەش نەکرد لە بینین. دیارە هەڤالانی مەڵبەندی ڕاپەڕینیش هاوکارمان بوون لە هەموو کارەکاندا. ئێوارانیش بە هیلاکی دەهاتینەوە ئوتێل بتوێن. هاتنی خەڵکی بەردەوام بوو، ئێمەش ماندوو بووبووین. ئەو ماوەیەی لەوێ بووین، نەمانهێشت هیچ کێشەیەک ڕووبدات و غەدر لە کەس بکرێ. تەنها یەک کێشەی بچوک ڕووی دا. کێشەکەش ئەوەبوو سەیارەیان لە کەسێکی گۆڕان سەند. بەڵام ئێمە قبوڵمان نەکرد و بۆمان گێڕانەوە. کەسەکان خزمی یەکتر بوون. تاکو ڕۆژی هەڵبژاردن ئەمە کاروپیشەمان بوو. دیارە لە چوارقوڕنە و حاجیاوا و شوێنەکانی تریش لەگەڵ فەرماندە و سەربازەکانی سنوورەکە کۆبووینەوە. لە کەناڵی تەلەفزیۆنیشەوە چاوپێکەوتنیان لەگەڵ کردین. بڕیار بوو ڕۆژی سێشەممە مام جەلال بێت بۆ ڕانیە و ماوەیەک لامان بێت و ئەویش چاودێریی هەڵبژاردنەکە بکات.

ڕۆژانە هەر سەرگەرمی هەڵبژاردن و چاوپێکەوتن بووین لەگەڵ عەشیرەتەکان و حیزبەکان کەسایەتییەکانی سنوورەکە. لەبەر ئەوەی لیستی کوردستانی پێکەوە بووین. لەگەڵ برایانی پارتی لە لقی ١١ کۆبوونەوەی هاوبەشمان کرد، کە هەڵۆی ئەحمەد کوردە لێپرسراوی بوو.

سەعات یانزەی ڕۆژی ٧/٧ مام جەلال گەیشتە ڕانیە و لەگەڵ دائیرەکانی سنوورەکە کۆبوونەوەی ئەنجام دا و سەرپەرشتیی کۆبوونەوەی هاوبەشی یەکێتی و پارتیی کرد. لە شاری قەڵادزە و ڕانیەش کۆبوونەوەی کرد و من و دکتۆر فوئاد مەعسوم لەگەڵیدا بووین. لەبەر شارەزایی و ناسیاویم لەگەڵ خەڵکی سنوورەکە سەردانی چەند ماڵە شەهیدێکم کرد، کە لە ڕۆژگارە ناخۆشەکاندا پێکەوە بووین.
ڕۆژی ٢٠١٠/٧/٢٠ کۆبوونەوەی فەرماندەیی بوو بە سەرپەرشتیی هەڤاڵ مام جەلال و بە ئامادەبوونی خۆم و شێخ جەعفەر و مەحموود سەنگاوی و کەمال شاکر. لەگەڵ هەموو هێزەکانی پێشمەرگەی یەکێتیی نیشتمانی لەسەر گرنگیی ئەم کۆبوونەوەیە و هەڵبژاردن قسەی بۆ کردن. لە هەندێک لە کۆبوونەوەکان لەگەڵ هەڤاڵ نەهرۆی سەعید سوفی پێکەوە بووین وەک لیژنەی هەڵبژاردن.
هەڵبژاردن ڕۆژی ٧/٢٥ دەستی پێکرد و تەواو بوو. چەند ڕۆژێ دوای هەڵبژاردن دەنگەکان جیا کرانەوە و بەم شێوەیەی خوارەوە بوو: لیستی کوردستانی لە سەدا ٥٧%، گۆڕان ٢٣%، چاکسازی ١٢%. کاک مەسعود بارزانی ڕێژەی لە ٦٩%ی دەنگی هێنا بۆ سەرۆکی هەرێم. ململانێیەکی گەورە هەبوو لە نێوان لیستی کوردستانی و گۆڕان. غەدرێکی زۆر لە مێژووی یەکێتی کرا. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لیستی کوردستانی سەرکەوتنی بەدەست هێنا. لە سلێمانی گۆڕان دەنگی باشیان هێنا، وەزعی یەکێتی باش نەبوو، لە جێگاکانی تریش باش نەبوو ئەگەر بەراوردی بکەی لەگەڵ خەباتی یەکێتیدا.
ئێوارەی چوار شەممە ٨/٥ مام جەلال تەلەفۆنی بۆ کردم و وتی سەعات هەشتونیو وەرە بۆ لام بۆ ماڵەوە. کە ڕۆیشتم، بڕیاری دا بە تەنها بچم بۆ سەرپەرشتیی هەردوو مەڵبەندی قەڵادزە و ڕانیە. لەڕاستیدا هەڵبژاردنەکە تووشی شۆکی کردبووین.

## له قه‌ڵادزه و ڕانیه

له ڕانیه سوکه‌باره‌گایه‌کم دانا و ده‌ستم کرد به جێبه‌جێکردنی ئه‌و کارانه‌ی پێیان سپاردبووم. هه‌موو دۆست و هاوڕێ و ئه‌وانه‌ی ئه‌مناسین، به‌سه‌رم کردنه‌وه. سه‌ردانی هه‌ندێک له بنه‌ماڵه گه‌وره و به‌هێزه‌کانیشم کرد. که‌وتمه ئه‌وه‌ی چی بکه‌ین بۆ ئه‌وه‌ی سه‌رکه‌وتن به‌ده‌ست بهێنین و دۆخه‌که وه‌ک ڕابوردوو نه‌بێت. لام وابێ که‌سێک نه‌ما بزانم ده‌وری کاریگه‌ری ده‌بێ و چاوم پێی نه‌که‌وتبێ. له‌گه‌ڵ ئه‌وانه‌شدا ده‌چوومه پرسه‌ی کۆچکردووه‌کان و به‌شدار ده‌بووم له‌گه‌ڵیان، ئه‌وه‌م به ئه‌رکی خۆم ده‌زانی. جارجاره‌ش ده‌گه‌ڕامه‌وه بۆ مه‌ڵبه‌ندی پێشمه‌رگه و چاوم له کاره‌کانی ئه‌ویش ده‌بوو. وام به خه‌یاڵدا هات بۆ ڕاپه‌ڕاندنی ئه‌رکه‌که‌م به باشی هه‌ندێک ئاڵوگۆڕ به کۆمیته‌کان و هه‌ندێک ده‌زگای حکوومه‌ت بکه‌م. به حوکمی ئه‌وه‌ی هه‌موو ده‌سه‌ڵاتێکیان پێدابووم، نه‌مده‌ویست غه‌در له که‌س بکرێت. له سه‌ره‌وه ته‌داخولات ده‌کرا، منیش ڕاپۆرتێکم ئاماده کردبوو بۆ حکوومه‌ت و حیزب.

له مه‌ڵبه‌ندی ٨ وه‌ک هه‌نگاوی یه‌که‌م ٦ لێپرسراوی کۆمیته‌م گۆڕی. خۆم بۆ دانانیان له‌گه‌ڵیان چووم. کارگێڕه‌کانی مه‌ڵبه‌ندم به‌سه‌ر کۆمیته‌کاندا دابه‌ش کرد بۆ ئه‌وه‌ی زیاتر بجوڵێن و سه‌رپه‌رشتییان بکه‌ن. جێبه‌جێکردنی ئه‌و به‌رنامه تازه‌یه‌ی ده‌ستم پێکردبوو، بێکێشه نه‌بوو. من خۆم بۆ هیچ مه‌به‌ستێک و دژی که‌س ئه‌مه‌م نه‌کرد. له هه‌ڵبژاردنی ڕابوردوو به هه‌موومانه‌وه زه‌ره‌رمان کرد و دۆڕاندمان. به سه‌روو و مه‌ڵبه‌ندیشه‌وه هه‌موومان له‌وێ بووین، ئه‌م گۆڕانکارییه‌م به‌لاوه باش بوو ئه‌گه‌رچی نیوه‌چڵیش بوو. ئه‌وه‌ی ویستم له حکوومه‌ت، له‌و کاته‌دا جێبه‌جێ نه‌کرا.

ڕێزانی خوشکم به هۆی نه‌خۆشییه‌وه وه‌زعی باش نه‌بوو. له‌و کاته‌دا مام جه‌لال و ملازم عومه‌ر له سه‌فه‌ری ئه‌مه‌ریکا بوون. له‌وێ به مام

جەلالیان وتبوو. هەر کە گەڕانەوە، ملازم عومەر لە فرۆکەخانەی سلێمانییەوە تەلەفۆنی بۆ کردم وتی بە مام جەلالم وتووە، ئەویش وتویەتی سبەینێ بێت بۆ لام، منیش سوپاسم کرد. ڕۆژی دوایی چووم بۆ لای مام جەلال، لەوێ مۆڵەتی دامێ و هاوکاریشی کردم بۆ سەفەر بۆ هۆڵەندا بۆ لای ڕێزانی خوشکم، کە لە خەستەخانە کەوتبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی زریانی کوڕم ناردبوو، چوونەکەم دواخست. چونکە دەستم دابووە هەندێک کار و نەدەبوو بە نیوەچڵی بەجێیان بهێڵم.

## پلینۆم

ڕۆژی ٢٠٠٩/١٠/٢٩ پلینۆم دەستی پێکرد. دکتۆر فوئاد مەعسوم سەرپەرشتیی دەکرد، کەسێکی لە سەرخۆ و بەویژدان بوو. دکتۆر فوئاد ڕاپۆرتی پێشکەش کرد و داوای کرد مام جەلال پێشکەش ڕاپۆرتی یەکێتی بخوێنێتەوە. ئەوەی پەیوەندیی بە پێشمەرگەوە بوو، بەر ئێمە کەوت. لیژنەی پێشمەرگە لەم هەڤاڵانە پێک هاتبوو: (شێخ جەعفەر، مەحموود سەنگاوی، جەباوەر یاوەر، کەمال شاکر، مامۆستا عەزیز، مستەفا چاوڕەش). ئێمەش لەگەڵ پەنجا کادێری پێشمەرگە دانیشتین و ڕاپۆرتێکمان لەسەر وەزعی پێشمەرگە و چاککردنی بۆ پلینۆم ئامادە کرد. ڕاپۆرتەکە لە چواردە خاڵ پێک هاتبوو. لەوێش هەندێک قسەی لەسەر کرا و بە دەنگی زۆرینەی پلینۆم قبوڵ کرا. پلینۆم ماوەی سێ ڕۆژی خایاند و ڕۆژی ١٠/٣١ کۆتایی هات.

**کۆبوونەوە لە ماڵی هەڤاڵ (دکتۆر بەرهەم ساڵح) سەرۆکوەزیران**

لە ماڵی دکتور بەرهەم بە ئامادەبوونی هەموو ئەندامانی فەرماندەیی گشتی کۆبوونەوەیەکی فەرماندەییمان کرد. هەڤالانی بەشداربوو پێک هاتبوون لە: ١- نەوشیروان فواد مەستی ٢- شێخ جەعفەر ٣- مستەفا چاوڕەش ٤- مەحموود سەنگاوی ٥- جەبار یاوەر ٦- کەمال شاکر ٧- مامۆستا عەزیز ٨- دلێری سەید مەجید ٩- هاشم مام عەلی، لەگەڵ سکرتێرەکانی لای هەڤاڵ بەرهەم سۆران و لەتیف شێخ عومەر. ئەم کۆبوونەوەیە زیاتر تەرخان کرابوو بۆ یەکگرتنەوەی هێزی پێشمەرگە، هەردوو فەرماندەییەکە کە لەسەری ڕێک کەوتبووین. چۆن دەبێ ئەم کارە جێبەجێ بکەین کە لەسەری ڕێک کەوتووین؟ قسەی زۆری لەسەر کرا.

هاوکات کەموزۆر هەر خەریکی دەوری قەڵادزە و ڕانیەم بۆ ئیشوکارەکان. کەسێکی دڵسۆز و پیاوێکی نیشتمانپەروەر لە قەڵادزە وەفاتی کردبوو "هۆمەری حاجی موسا"، بەشداریی مەراسیمی پرسەکەم کرد. نامەیەکم نووسی بۆ مام جەلال لەسەر ئەو ماوەیەی سەرپەرشتیی سنووری پشدەر و بتوێنم دەکرد و کارەکانم بۆ ڕوون کردەوە. وێنەیەکیشم دا بە مەکتەبی سیاسی. وێنەی نووسراوەکەشم بۆ مەڵبەندی هەشتی ڕاپەڕین خوێندەوە. ماوەی چوار مانگ لەوێ ئیشم لەگەڵ کردن. دوای کۆبوونەوەکە خواحافیزیم لێکردن و گەڕامەوە بۆ سلێمانی و چوومە مەڵبەندی ڕێکخستنی پێشمەرگە بۆ جێگاکەی خۆم.

**چوونمان بۆ پیرمام بۆ لای سەرۆکی هەرێم**

بە سەرپەرشتیی سەرۆکی هەرێم مەسعود بارزانی کۆبوونەوەیەکی هاوبەشمان هەبوو لە نێوان فەرماندەیی و فەلەک. سەعات دە کۆبوونەوەکە دەستی پێکرد. لە پاش قسەکردن و ڕاگۆڕینەوە بڕیارمان دا بەزووترین کات کار بکەین بۆ یەکخستنەوەی هێزی پێشمەرگە. کاک مەسعود دەسخۆشیی لێکردین بۆ کارەکانی ڕابووردومان. هەر لەو

کۆبوونەوەیەدا بڕیار درا چەند لیژنەیەک دروست بکرێن بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکان. کۆبوونەوەکە کۆتایی هات و گەڕاینەوە بۆ سلێمانی.

دوا بەدوای ئەم کۆبوونەوەیە چەندین جار هەردوولامان کۆبوونەوەمان کرد بۆ ئەوەی هەنگاوبەهەنگاو لە کارەکان بچینە پێشەوە و یەکخستنەوەی هێزی پێشمەرگە زیاتر و زووتر جێبەجێ ببێ. کاری زۆرمان کردووە، بەڵام هەر ماویەتی. تاکو ئێستا دوانزە لیوامان بە یەککگرتوویی ڕێکخستووە و دەبێت بەردەوام کاری بۆ بکەین. دیارە ئەم کارە هەروا بە ئاسانی نەهاتۆتە پێشەوە، لەسەر هەموو ئاستەکان کارمان کردووە. بێجگە لەوەی خۆمان کارەکەمان ئەوەبوو، دەبوو مام جەلال و مەکتەبی سیاسییش لە هەموو هەنگاوەکان ئاگادار بکەین و ڕاوبۆچوونیان وەربگرین.

## جارێکی تر هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق و چوونم بۆ پشدەر

ڕۆژی ٢٠١٠/٢/٣ لە مەکتەبی سیاسی بڕیارێکیان دەرکرد کە جارێکی تر بڕۆمەوە بۆ قەڵادزە و ڕانیە بۆ سەرپەرشتیی هەڵبژاردن. هەڤاڵەکان بەسەر ناوچەکاندا دابەش دەکران. بۆ ئەم مەبەستەی هەڵبژاردن قسەم کرد کە هەموومان هیمەت بکەین و سەرکەوتوو بین.

وردەوردە بانگەشەی هەڵبژاردن دەستی پێکردووە، بەڵام توندوتیژە و دەبێ هەستیارانە لەگەڵی بجوڵێینەوە، بەتایبەت لەو سنوورە. مام جەلالیش هاتبووەوە و لە بارەگای مەکتەبی سیاسی سەرپەرشتیی کۆبوونەوەی کرد کە لەسەر هەڵبژاردن بوو. ئەوەی من بە باشم زانی، بە ڕاوێژ لەگەڵ هەڤاڵانی ڕاپەڕین جێبەجێمان کرد. خەڵکی بە خۆشییەوە ئامادە بوون بۆ هەڵبژاردن.

مام جەلال لە کەرکووکیش لە بارەگای خۆی سەرپەرشتیی کۆبوونەوەیەکی سەرکردایەتیی کرد بۆ ئەوەی خەڵکی بزانێ کە

کەرکووک لە کوردستان جیا نابێتەوە و کوردستانە. ئیشێکی زۆرم کرد بۆ سەرکەوتنی کاندیدەکانی یەکێتی نیشتمانی و دەریش چوون. ڕۆژی ٣/٥ سەعات سێونیو بەشداریی ئاهەنگی سالڕۆژی ڕاپەڕینی شاری ڕانیەم کرد و چوومە سەر مەزاری شەهیدان (عەلی نەبی و ئیسماعیل وەرتێ و ئەرسەلانی کاک هەمزە و شەهیدە قارەمانەکانی تری یەکێتیی نیشتمانی). بانگەشەی هەڵبژاردن ڕاوەستا و دنیا هێمن بووەوە. ڕۆژی ٢٠١٠/٣/٧ هەڵبژاردن دەستی پێکرد. هەر ڕۆژی ٣/٧ ڕۆژی ڕزگارکردنی شاری سلێمانییە لە دەست ڕژێمی سەدام و خۆشترین ڕۆژی خەڵکی ئەو شارەیە. منیش وەک هەموو تاکێکی کورد بەشداریم کرد و دەنگی خۆم دا بە لیستی کوردستانی. چواردە هەزار دەنگی زیاتر بوو. لە شارو ناحیەکانیش لیستی کوردستانی سەرکەوتوو بوو. هەردووکی نزیکەی لەسەروو شەست هەزار دەنگی زیاتر بوو، هەر ئەمەش وای کرد لیستی کوردستانی بەگشتی لە سنووری سلێمانی سەرکەوتوو بێ. منیش بە سەرکەوتنێکی باشم زانی بۆ خۆم، چونکی لە ڕابوردوودا دۆڕاندبوومان. ئەمجارە تەنهاش بووم.

زریانی کوڕم ڕۆژی ٢٠١٠/٤/٢ ژنی گواستەوە. لە هۆڵی ئۆسکار ئاهەنگێکی خێزانیی گەورەمان بۆ بەڕێوە برد، ڕۆژێکی خۆشی و شادی بوو بۆ خۆیان و کەسوکاریش. شەوێ درەنگ مەراسیم کۆتایی هات.

### یادی داستانی گردە بێناس

سەعات شەش چووم بۆ قەڵادزە و لەوێشەوە لەگەڵ هەڤاڵە پێشمەرگە کۆنەکانی ئەو سەردەمە بۆ لای شاخی گردە بێناس. تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان بەرنامەی هەبوو بۆ تیپەکانی ئەو سەردەمە، منیش لەبەر خاتری ئەو پێشمەرگانەی ڕۆژگارە سەختەکان چووم. چونکی من لێپرسراوی یەکەمی داستانی "گردە بێناس" بووم و

ئەو ڕۆژگارە سەرپەرشتیی هێزەکانم کرد. لە سەروبەندی شەڕەکەدا بارەگاکانی مەکتەبی سیاسیی یەکێتیمان لە سەرشیوەوە گواستەوە بۆ بەرگەڵوو و سەرگەڵوو. لە شەڕەکەدا سەربازێکی زۆر کوژران و دەستکەوتێکی زۆرمان لە دوژمن گرت لە کلاشینکۆف و ئاربیجی و بەسەر هێزەکانی بەشداربووی شەڕەکەدا دابەشم کردن. ئەم سەرتیپ و کادیرانە لە شەڕەکەدا بەشدار بوون: (شەهید مام جوتیار، مەولود هێرۆیی، عەبدوڵلا وسوو، شەهید محەمەد ڕازانی، مەحموود ڕازانی، عەبدوڵلا مەحموود، عەلی شامار، عەبدوڵلا هەمزە)، هەروەها دەیان پێشمەرگەی تر دەوریان هەبوو.

### بەرەو کۆنگرە

پاش ئەوەی مەکتەبی سیاسی بڕیاری دا کۆنگرە بگیرێ، هەموو مەڵبەند و کادیرەکانی سەرگەرم بوون. منیش لەگەڵ هەڤالانی مەڵبەندی پێشمەرگە بۆ ئەو مەبەستە چەند کۆبوونەوەیەکمان کرد بۆ ئەوەی کارێکی وا بکەین کۆنگرە سەرکەوتوو بێ، لەگەڵ هەموو بەشەکانی مەڵبەند کۆبووینەوە و دابەش بووین بۆ ئەو جێگایانەی هێزەکانمانی لێیە.

بڕیار درابوو مەڵبەندەکان لە هەر پێنج سەد ئەندام یەک نوێنەری هەبێ، هێزی پێشمەرگەش لە سێسەد و پەنجا ئەندام یەک نوێنەری هەبێ. ڕۆژانە لەسەر ئەو بەرنامەیە کاری خۆمان ئەنجام دەدەین. ڕۆژی ٤/٢٣ بە ئامادەیی مام جەلال لە قەلاچوالان کۆبوونەوەیەکی ئەفسەرە پلە بەرزەکانمان کرد بە بەشداریی شێخ جەعفەر و مەحموود سەنگاوی و بەندە. مام جەلال لەسەر گرنگیی هێزی پێشمەرگە قسەی بۆ کردین. لەسەر سەرخستنی کۆنگرەش هەندێک ڕاوبۆچوونمان خستە

بەردەستی مام جەلال. دوای ئەوە هەندێک ئاڵوگۆڕ کرا لەناو هێزەکان پێشمەرگە، کاک نەوشیروان فوئاد مەستی خۆی وازی هێنا و خانەنشین بوو، لە جێگای ئەو حسێن مەنسوور دانرا. لە کۆبوونەوەکەدا ئاگاداری پلەدارەکانمان کرد بۆ ئەم مەبەستە، بەڕاستی کاک نەوشیروان دەوری سەرەکیی بینی لە بەهێزبوون و دروستکردنی سەرۆکایەتیی ئەرکاندا.

**هاتنی جەنەڕاڵ باربارۆ**

لەگەڵ هەڤاڵ مەحمود سەنگاوی چووین بۆ پێشوازیکردن لە جنراڵ باربارۆی گەورە ئەفسەری هێزەکانی هاوپەیمانی و لەگەڵ خۆمان بردمان بۆ لای مام جەلال. لەسەر وەزعی عێراق و تیرۆر قسەیان کرد. ڕۆژی دواتر جەنەڕاڵ "ئۆدیرنۆ" قائدی عەسکەریی ئەمەریکی هات. چووین بۆ دوایدا بۆ فڕۆکەخانە و بردمان بۆ لای مام جەلال. دوای ئەوەش ڕۆژی ٢٠١٠/٤/٣٠ لەلای مام جەلال ئەم هەڤالانە کۆبووینەوە: (شێخ جەعفەر، مستەفا چاوڕەش، مەحموود سەنگاوی، مامۆستا عەزیز) کۆبوونەوەکە تایبەت بوو بە باسکردن وەزعی پێشمەرگە و باشکردنی ژیانی. کۆنگرەش ئەوەندەی نەمابوو. لەسەر ئەوە مام جەلال وتی دەبێ گرنگی بدەن بە کۆنگرە. دوایی بۆ هەمان مەبەست سەردانی کاک کۆسرەتم کرد و لەسەر ژیان و گوزەرانی پێشمەرگە باسوخواسمان کرد، دیارە باسی کۆنگرەش خاڵێکی تر بوو. ئێمە هەمیشە کێشەی ژیان و وەزعی پێشمەرگەمان دەخستە بەردەستی سەرووی خۆمان بۆ ئەوەی بە هەموومانەوە ڕێگای باشتر بدۆزینەوە بۆ باشکردنی ژیان و گوزەرانیان و دابینکردنی پێویستییەکانیان.

هەر دەربارەی کۆنگرە و نزیکبوونەوەی لیژنەیەکی مەکتەبی ڕێکخستن هاتن بۆ لامان و لەگەڵیان دانیشتین. قسەوباسەکانمان لەسەر

ئەو خالانە بوو، کە پێویست بوو ئامادەی بکەین و بەشداریکردنیشمان چۆن بێت.

ڕۆژی ٥/٨ هەڵبژاردن لە کۆمیتەکان دەستی پێکرد. بەڵام لەلای ئێمە هێزی پێشمەرگە هەڵبژاردن نەکرا، لەبەر ئەوەی هێزەکانمان زۆر بەربڵاو بوون لە جێگا جیاوازەکانی عێراق و کوردستان واجباتیان دەگرت. خاڵێکی تریش ئەوەبوو لەناو هێزی پێشمەرگەدا هەڵبژاردن ناکرێ، بۆ ئەوەی کاریگەریی خراپ نەکاتە سەر هەڵبژاردن. چونکی هەڵبژاردن ئامانج نییە، جاری وا هەیە باشترین کەس دەرناچێ. لە ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ)دا شتێکم نووسی بە ناوی "کۆنگرەمان بۆچی ئەوێ و چی بکەین باشە؟" لای خۆمەوە سەردانی مەکتەبی ڕێکخستن "هەڤاڵ عیماد" و دەزگای هەڵبژاردن "شۆڕش ئیسماعیل" و مەکتەبی سیاسیم کرد بۆ ئەوەی مەڵبەندی ڕێکخستنی پێشمەرگە مەغدور نەبێ لە بەشداریکردن، چونکی گەورەترین مەڵبەندی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانە. بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ هەڤالانی مەڵبەند خەریک بووین. چاوەڕوان بووین مام جەلال لە بەغدا بگەڕێتەوە. لەبەر گرنگیی هەڵبژاردن چوار هەڤاڵی جێگری مەڵبەند لەگەڵ دکتۆر فوئاد چوون بۆ بەغدا بۆ لای مام جەلال. شەوێ تەلەفۆنیان لەگەڵ کردم و وتیان هەڵبژاردن دەکرێ بەیەک بە شێوەی بازنەیی دەکرێ. ڕۆژی دوایی ئەو هەڤاڵانەی چووبوون بۆ بەغدا بۆ لای مام جەلال، گەڕانەوە و قسەمان لەسەر چۆنێتیی بەڕێوەچوونی کۆنگرە کرد. بڕیار بوو ئەو هەڤاڵانەی بەشداریی کۆنگرە دەکەن، ئاگادار بکرێن و "١٥٢" ئەندام مەڵبەندی پێشمەرگە بەشداریی کۆنگرە بکەن. ڕۆژی دوایی چووم بۆ قەڵاچوالان بۆ سەرپەرشتیی بەڕێوەچوونی هەڵبژاردن.

## دوا کۆبوونەوەی سەرکردایەتی پێش کۆنگرەی سێیەم

رۆژی ٢٠١٠/٥/٣١ دوایین کۆبوونەوەی سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانی بوو پێش کۆنگرە. مام جەلال سەرپەرشتیی کرد و لە دەستپێکی کۆبوونەوەکەدا سوپاسی هەمووانی کرد کە هەموو بەجدی کاریان کردووە بۆ سەرخستنی کۆنگرە. داوای لێبوردنی لە هەڤاڵان کرد و وتی ئەگەر رۆژی لە رۆژان هەڵەیەکم کردبێ، تەحەمولی بەرپرسیاریەتی دەکەم. هەموومان بەشداریی قسەکانمان کرد. رۆژی دواتر کۆنگرە لە ٢٠١٠/٦/١ دەستی پێکرد.

## یەکەم رۆژی کۆنگرەی سێیەم

رۆژی ٢٠١٠/٦/١ سەعات یانزە کۆنگرە لە هۆڵی تەلاری هونەر بە ئامادەبوونی وەفدی میوان و سەفیرەکان و حیزبە عێراقی و کوردستانییەکان پاش قورئانخوێندن و سرودی مەشخەڵان دەستی پێکرد. مەسعود بارزانیی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان بەشدار بوو. بەخێرهاتنی هەمووان کرا. چەندین وتار خوێنرانەوە، لەوانەش وتاری مەسعود بارزانی، وتاری مالکی و حیزبی دەعوە، دوایی (عمار الحکیم) سەرۆکی مەجلیسی ئەعلا و حیزبی سۆسیالیستی سوید و باقیی لایەن و حیزبەکانی تر.

رۆژی یەکەم کۆتایی هات، شەویش لە یانەی کۆمەڵایەتی ئاهەنگێکی قەشەنگ بۆ میوانان و بەشداربووانی کۆنگرە ساز کرا. دوایی سەردانی هەندێک لە هەڤاڵەکانم کرد لە جێگای حەوانەوەیان، ئەوانەی لە دوورەوە هاتبوون.

## ڕۆژی ٦/٢ دووەم ڕۆژی کۆنگرە دەستی کرد بە کارەکانی

مام جەلال ڕاپۆرتی خۆی خوێندەوە، ماوەیەکی باشی خایاند. دوای چارەکێک پشوو کۆنگرە دەستی پێکردەوە و ماوەی دوو سەعات و نیوی خایاند. ڕاپۆرتەکەی مام جەلال بە دوورودرێژی باسی وەزعی یەکێتی و کێشەکان و پێشکەوتنەکانی کرد. دوای ئەوە سەرکردایەتیی یەکێتی خۆی حەل کرد. ئیتر کۆنگرە گەورەترین دەسەلاتە. ئیدارەی سەرپەرشتیی کۆنگرە هەڵبژێردرا، کە پێک هاتبوو لە نۆ کەس و سیانیان ژن بوون. کارەکان دەستیان پێکرد. هەڤاڵ عادل موراد بەرپرسی یەکەم بوو.

## ڕۆژی سێهەمی کۆنگرە

چەندین بڕیار درا بۆ بەشداری و چاودێریی ئەوانەی لەسەر لیستی یەکێتی لە وەزارەت و پەرلەمانن. بە زۆرینەی دەنگ پەسەند کرا. چەند لیژنەیەک دروست کرا بۆ ڕاپۆرتەکەی بەشەکانی پێشمەرگە، دارایی، ڕێکخراوەکان و مەڵبەندەکان و حکوومەت. من لێپرسراوی لیژنەی پێشمەرگە بووم، داواش کرا هەر کەسێک پێی خۆشە و حەز دەکات، دەتوانێ لەگەڵمان بێت.

لیژنەکەمان پێک هاتبوو لە (شێخ جەعفەر، مەحموود سەنگاوی، جەمیل هەورامی، م. ئەحمەد لەتیف، عەبدوڵلا کانی بەردی، جەبار یاوەر). بۆ هاتن و گفتوگۆی پێشمەرگە نزیکەی سەد و پەنجا هەڤاڵ بەشدارییان کرد لەو ڕاپۆرتەی بۆ کۆنگرەمان ئامادە دەکرد. لەو هەڤالانە "٣٥" کەسیان قسەیان کرد، بڕیاریشمان دا بۆ ڕۆژی دوایی تر لە بارەگای پێشمەرگە دێرینەکان جارێکی تر لەسەری کۆببینەوە و پێیدا بچینەوە. هەڤاڵ عومەر فەتاحیش هات بۆ لامان و بەشداریی کردین. ئیتر ڕۆژی دوای خۆئامادەکردنە بۆ ڕاپۆرتەکانی تر و لەسەر خاڵبەخاڵی گفتوگۆ کرا.

## ڕۆژی پێنجەمی کۆنگرە

هەر لە تەلاری هونەر هەندێک لە ڕاپۆرتی کۆمیتەکان کە دروست کرابوون، خوێندرانەوە و قسەیان لەسەر کرا.

## ڕۆژی شەشەمی کۆنگرە

کۆبوونەوەکان دەستیان پێکردەوە. دوای نیوەڕۆ سەرەی ڕاپۆرتی کۆمیتەی پێشمەرگە هات. چووینە بەردەم هەڤالانی کۆنگرە. من ڕاپۆرتەکەم خوێندەوە، پاش ئەوەی دە کەس قسەیان لەسەر کرد، خرایە دەنگدانەوە و بە زۆرینەی دەنگ ڕەزامەندیی لەسەر درا. ڕۆژانی تریش لیژنەکانی تر کارەکانی خۆیان پێشکەش کرد. ڕۆژی حەوتەمی کۆنگرە کێشەیەک لەسەر بەشداربووانی کۆنگرە دروست بوو: کێ حەقی هەیە بەشدار بێ؟ چونکی ڕێژەی بەشداربووان لەو ژمارەیە زیاتر بوو، کە بڕیاری لەسەر درابوو. ئەمەش چارەسەر کرا "لە ڕاستیدا دیزە بە دەرخۆنە کرا". کۆمیتەی بەڕێوەبردنیش مشتومڕێکی لەسەر کرا و دوایی دەنگی لەسەر درا. ڕۆژێکیش تەرخان کرا بۆ پەیڕەوی ناوخۆ و زۆر قسەی لەسەر کرا. باقیات هەڵگیرا بۆ ڕۆژی دوایی تر.

ڕۆژی دەیەمی کۆنگرە هەردوو جێگری سکرتێری گشتی هەڤالان کۆسرەت ڕەسول و دکتۆر بەرهەم ساڵح وەک جێگری سکرتێری گشتی دەستنیشان کران و زۆرینە دەنگی لەسەر دا. ئێوارەش هەڵبژاردن دەستی پێکرد. کۆنگرە بڕیاری دابوو سەرکردایەتی پەنجا ئەندام بێ، بەم شێوەیە ژمارەی پەنجا هەڤاڵ هەڵبژێردران بۆ کۆمیتەی سەرکردایەتی. من خۆم دەنگی سیانزەهەمین بووم و "٦١٨" دەنگم هێنا، لە کۆنگرەی دووەمدا شەشەم دەنگم هێنا بە ڕێژەی "٧٦٢" دەنگ، لە کۆنگرەی یەکەمیش دەنگی باشم هێنا. یەکێتی سێ کۆنگرەی گرتووە لە هەرسێکیان ڕێژەی دەنگەکانم بەرز بووە و قەت یەدەک نەبووم. ئەوەش دەنگی کادیرەکان و پێشمەرگەکان بوو و حەقی خۆمیان داوەتێ، سوپاسیان دەکەم. پاش ئەوەی کۆنگرە تەواو بوو، زۆر لە هەڤالان هاتن بۆ پیرۆزبایی.

## هەڵبژاردنی مەکتەبی سیاسی دوای کۆنگرە

ڕۆژی ٢٠١٠/٦/٢٤ سەعات "١١" لە دەباشان لە ماڵی مام جەلال کۆبوونەوەی سەرکردایەتی بە سەرپەرشتیی هەردوو جێگری سکرتێری گشتی هەڤاڵ (کۆسرەت و هەڤاڵ بەرهەم) دەستی پێکرد، تەنها عیماد ئەحمەد لەوێ نەبوو، لە سەفەر بوو. سەرەتای کۆبوونەوە مەکتەبی سیاسی هەڵبژێردرا، مام جەلال هەشت کەسی دەستنیشان کردبوو بۆ مەکتەبی سیاسی، کە ئەم هەڤالانە بوون: ١- ڕەفعەت عەبدوڵڵا ٢- دکتۆر نەجمەدین کەریم ٣- عماد ئەحمەد ٤- مەلا بەختیار ٥- هێرۆ ئیبراهیم ئەحمەد ٦- عومەر فەتاح ٧- عەدنان موفتی ٨- ئەرسەلان بایز.

دیار بوو مام جەلال حسابی لەسەر شارەکان کردووە و ئەم هەڤالانەی داناوە. بێگومان حەقی خۆیەتی، بەڵام لە کۆنگرەدا دەنگ هەر دەنگە و حەق وابوو حسابی لەسەر بکرێ. لە کۆبوونەوەکەدا بڕیار درا سێ هەڤاڵی تر دەستنیشان بکرێن و بخرێتە دەنگدانەوە، لەو هەڤالانەی کە پشتیوانییان لێکرا، ئەم سێ هەڤاڵە دەرچوون بۆ مەکتەبی سیاسی: ١- شێخ جەعفەر ٢- حاکم قادر حەمەجان ٣- مەحموود سەنگاوی، باقیات مانەوە و ئیحتیات بوون. بەڵام تاکو ئێستا هەر دەوری (ئەندامی مەکتەبی سیاسی) دەبینین. من لە گرنگیی هیچ هەڤاڵێک کەم ناکەمەوە، بەڵام بە حەقی تەواو و شەرعیی خۆمی دەزانم لە پێشەوەی زۆر لەو هەڤالانە بم، ئەگەر بە دەنگ بێ و دەنگی هۆڵی کۆنگرە بێ. زۆر دڵگران بووم دەرنەچووم، وتم لە ڕابوردووش سیاسەت هەروا بێوەفا بووە. دەستەگەری و پشتیوانی لە سەروو خۆتەوە گرنگە، ئیتر هەرچەند بیرم دەکردەوە و سەرم دەهێناو دەبرد، هەر خەفەتم پێ دەخوارد. مەبەستم ئەوە بوو خۆ مەسەلەی مەکتەبی سیاسی ئەوەیە هەموو کەسێک حەز دەکات لە پلەی بڕیاردانادا بێت و پلەی بەرزتر بێت. ئیتر نامەوێ زۆر بچمە وردەکاری و گێژاوی ئەم و ئەوەوە، تەنها ئەوەندە دەڵێم بۆ مێژوو و هەڤالانی کۆنگرە شاهیدن و ڕابوردووشم لەناو یەکێتیدا

شاهیدە کە هەمیشە حەزم بە دەستەگەری نەکردووە، هەر دەستەی یەکێتیی ناو یەکێتی بووم، هەموو هەڤاڵەکانی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی دەزانن کە لە ژیانمدا هەر وام هێناوە، خۆشم لە هیچیان پێ کەمتر و کەمتواناتر نییە لە هەموو بوارەکاندا، خۆ لەناو ڕیزەکانی یەکێتی و هێزی پێشمەرگە و خەڵکیدا لێ ئەگەڕێم خۆیان شاهیدیم بۆ بدەن، ئەوەندەش کە لەسەر هەڵبژاردن نووسیومە، بەسە.

ئەو ڕۆژانەی دوای کۆنگرە هەر لە دڵی خۆمدا ڕاوێژم دەکرد و بڕیارم دا واز لە سەرکردایەتیی یەکێتی بهێنم، نەک یەکێتی. چونکی تەمەنی خۆم و لاوێتی و کەسوکارم داوە بە یەکێتی. دواجار نامەیەکی گلەییئامێزم بۆ هەڤاڵ مام جەلال نووسی. هێشتا نامەکەم نەناردبوو، بەڵام ئامادەم کردبوو. چوومە لای هەڤاڵ عیماد ئەحمەد کە بەرپرسی مەکتەبی ڕێکخستن بوو. نامەکەم نیشان دا، هەڤاڵ عیماد لەسەر ناوەڕۆکی نامەکە قسەی نەبوو، تەنیا تێبینی لەسەر وشەی "وازهێنان" هەبوو و پێی باش نەبۆو ئەو وشەیە بنووسم. دوایی نامەکەی دابوو بە کاک دلێری سەید مەجید بۆی ببات. بە هەرحاڵ، نازانم گەیشت بە دەستی مام جەلال یان نا. کۆمەڵێک هەڤاڵ کە لە ساڵەکانی تەمەنی یەکێتیدا پێکەوە زۆر تاڵی و ناخۆشی و دەردەسەریمان دیووە، نەسیحەتیان کردم هەر ئیش بکەم و پەلە نەکەم لە وازهێنان. چونکی وەزعی من وەک هەندێک هەڤاڵی تر نییە و هی ئەوە نییە لێرەدا باسی بکەم. وەزعی زۆر جیاوازە لە هەندێکی تر. ئەوەتا تا ئێستا تاکو کاتی نووسینی ئەم بیرەوەریانە بەردەوامم.

بیرەوەرییەکانیشم کە لە ساڵەکانی ١٩٥٦ەوە دەست پێکردووە، وام دانابوو تاکو کۆنگرەی سێ بێ لەوێدا کۆتایی پێ بهێنم، چونکی ئەوەی گرنگ و دیار و زەحمەت بوو، ڕابوردوو بوو. ئەمانی تر، بەتایبەت ئەم ساڵانەی دوایی، زیاتر بیرهێنانەوەیە و کەمیش نییە. زیاتر لە پەنجا ساڵ باس دەکات. لە پێش هاتنە ناو کایەی حیزبایەتی و سیاسەتەوە زۆر

شتم لەبیر بووە و یاداشتم کردووە. یادەوەریی ڕۆژگارەکان کە پێیاندا تێپەڕیووم، ئەوەندەی لە بیرم بووبێ، بە ئەمانەتەوە یاداشتم کردووە، ئەوەندەی کە ئەمەوێ بیڵێم و حەق بدەم بە هەموو هەڤاڵەکانی ڕێگای خەباتم، ئەگەر شتێکم لە بیر نەبووبێ، داوای لێبوردنیان لێدەکەم. لە بیرەوەریی ئەو ڕۆژگارە دژوار و سەختەدا شت لەبیر دەچێ، بەتایبەتی ئەگەر جێگایەک نەبێت بتوانی بە ئەمانەتەوە هەندێک نووسینی تێدا هەڵبگریت. هەر هەمووشمان ڕژێمە دیکتاتۆرە بێڕەحمەکەی سەدام حسێن دەناسین و لە بیرمانە. کەسێک بە ناوی "دلێر عەبدوڵڵا عەزیز" لە سێدارە بدرێ تەنیا لە پای ئەوەی لە خۆشەویستیی پێشمەرگەیدا وێنەیەکی لەگەڵ گرتووم، ئیتر نابێ چاوەڕوانی شتی تری لێ بکەین. سیاسەت هەر ماوە و ئێمەش لە زیادە ماوین. دەیان هاوڕێی خۆشەویست و قارەمانمان لەدەست چوو؛ یادیان بەخێربێت. منیش هەر بەردەوامم لەسەر کار لەناو کوڕانی هەژارترین چین، کە پێشمەرگەیە. خۆشم هەر لەو قوتابخانەیە پێگەیشتووم و لەگەڵیان ماوم. ئەو هەڤاڵانەی ئێستا پێکەوە ئیش دەکەین، شاهیدن کە دڵ و دەروونمان لای سەرکەوتنی پێشمەرگەیە لە هەر سەنگەرێکدا بن. جارجارەش کە تەنگژەو ناڕەحەتی لەگەڵ ناحەزان و حکوومەتی عێراق دروست دەبێ، هەروەک ڕۆژگارەکانی ساڵانی پێشوو لەگەڵیاندا دەبم. مەگەر هەر ئێمەمانان و خەڵکی بەویژدان سەنگی پێشمەرگە بزانێت، "قەدری زێڕ لای زەڕەنگەرە". سەری ڕێزم دادەنەوێنم و هەتا مابم خۆم بە قەرزاری شەهیدەکان و کەسوکاریان دەزانم. وەفاش بۆ ڕێبازی پیرۆزیان، هەر خۆم بە سەربازیان دەزانم.

## دوا وته

دەمەوێ بیڵێم بە هۆی کەسێکەوە بە ناحەق زۆر قسە بە هەموومان دەوترێت. لە کۆتاییدا من هەر کوڕە هەژارکەی جارانم. نە دەوڵەت و نە ئەو قەسروقسوورەی باسی دەکەن، بە هی خۆمیان نازانم و بەلامەوە گرنگ نین. شارە قارەمانەکەی سلێمانی و هەموو ئەو جێگایانەی لە ڕابوردوودا ئیشم لێکردوون، دەکەم بە شاهید. لە کۆتاییدا دەڵێم ئینسان مەعسوم نییە لە هەڵە، زۆر زۆر داوای لێبوردن دەکەم ئەگەر لە نووسینەوەی ئەم یادەوەرییانەدا غەدرێکم لە نووسینەوەدا کردبێ. هیوامە ئەمەش بە کارە باشەکان حساب بکرێ و بچێتە سەر خەرمانی تێکۆشانی میللەتەکەم و خەباتی پێشمەرگە... ئێوەش هەر شاد و سەرکەوتوو بن.



سالّی ١٩٥٩، تیپی دووەمی (هێرش) گەڕەکی سابونکەران. ئەوانەی دانیشتوون لە چەپەوە: عەلی مەعسوم، کەمال عەباس، مستەفا چاوڕەش، غەفوری شێخ مەحمود، هەڵگورد عارف، ئەکرم حەپسە. ئەوانەی ڕاوەستاون، لە ڕاستەوە: ماجد ساحیبقەران، فەرەیدون زەنگەنە، سالّح محەمەد ئەمین، عەبدول برای حاجی محەمەد، سیروان خەفاف، ڕەفیق خلفە فەرەج کەبابچی، عەلی مەلا تاهر



سالّی (١٩٦٥) بەرزیوە لای ڕەواندز، بارەگای حزبی شیوعی.
دانیشتووەکان چوارەم کەس لەلای چەپەوە (مستەفا چاوڕەش)





مەحمود ڕەشید (نەبەز) زاهیر مەحمودی برای مستەفا چاوڕەش
بریندداربوون بە بۆمبی فسفۆر ساڵی ١٩٧٤ لە گەروی هۆمەر ئاغا



ناوچەی شەمزینان ساڵی (١٩٧٧) لەڕاستەوە: نەوشیروان مستەفا، کاک ئازاد هەورامی، (...)، (...)، مستەفا چاوڕەش، (...)



گوندی زێوکە/ ئێران. مانگی ١٢ی ١٩٧٧. لە ڕاستەوە جەبار عەلی عەوێز. کەریم دادە مەنە. ملازم عومەر، نەوشیروان مستەفا، عوسمان قادر منەوەر، مستەفا چاوڕەش، هاوڕێ جەبار. دانیشتووەکان: ئازاد دەرەمیانە، حەبیب، (نەناسراو) شەهید فاروق محەمەد



مستەفا چاوڕەش و عوسمان قادر منەوەر، شاربازێر ١٩٧٩



لەتیف حەمەمراد. ساڵی ١٩٦٩ لە بەعداد ئیعدامکرا



دێی بڵەسەن، نزیک بانه ساڵی ١٩٧٩. له ڕاستەوه: مستەفا چاوڕەش، حەمەئەمین ئاغای بارێ، محەمەجی حاجی ڕەشیدی بڵەسەن، فەتاح خان سالوک.



شەهید جەمالی عەلی باپیر و مستەفا چاوڕەش. ١٩٧٩



نێوزەنگ ساڵی ١٩٧٩. لە ڕاستەوە: مستەفا چاوڕەش، محەمەدی حاجی مەحمود، شەهید جەمال عەلی باپیر، شەهید عوسمان قادر منەوەر. دانیشتووەکان: خالید عەباس، ئاوات قارەمانی



نێوزەنگ ساڵی ١٩٨٠، نەوشیروان مستەفا، شازاد سائب، مستەفا چاوڕەش، عەلی شامار





شـەهید بێـستون مەلا عـومەر سـاڵی (١٩٨٧) لەسیروان شەهید بوو.

شەهید ئەکرەمی وەستا حەمەئەمین بەناسراو بە ئەکرەمی حەپسە، ساڵی (١٩٨٠) لە موسڵ لە سێدارە درا



لە نەخۆشخانەی (لەندەن بریج) لە لەندەن. ساڵی ١٩٨٧



له نەخۆشخانەی (لەندەن بریج) لە لەندەن. ساڵی ١٩٨٧



له نەخۆشخانەی (لەندەن بریج) لە لەندەن، ساڵی ١٩٨٧



مستەفا چاوەڕەش، لە نەخۆشخانەی (لەندەن بریج) لە لەندەن. ساڵی ١٩٨٧




نەخۆشخانەی (لەندەن بریج) لە لەندەن



شەقڵاوە. کۆبوونەوە بە سەرپەرشتی مەسعود بارزانی پێش شەڕی (پەکەکە) ساڵی (١٩٩٢)



پارێزگاری کەرکوک. ساڵانی (١٩٩٢/ ١٩٩٣/ ١٩٩٤)



مستەفا چاوڕەش و مەلا عەلی عەبدولعەزیز ڕابەری بزووتنەوەی ئیسلامی. ١٩٩٩/٥/١١



مامۆستا شێخ محەمەد بەرزنجی و مستەفا چاوڕەش. قەڵاچوالان ١٩٩٩/٩/١

مستەفا چاوەڕەش،
عومەر شیخ موس،
عوسمان ئۆجەلان.
١٩٩٩/١٢/١٤
بناری قەندیل دێی
سێوەیس





سوێندخواردنی پەرلەمان
لەبەردەم سەرۆکی
پەرلەمان
د. ڕۆژ نوری شاوەیش
٢٠٠٢/١٠/٤



لەگەڵ بەڕێز مام جەلال ٢٠٠٨/١١/٣٠



مەکتەبی عەسکەری یەکێتی نیشتمانی. لە لای ڕاستەوە:
مەلا یاسین، ڕەهبەری سەید ئیبراهیم، مامۆستا عەزیز، شیخ جەعفەر، مام جەلال، مستەفای سەید قادر. مستەفا چاوڕەش، هاشم مام عەلی.



لەگەڵ مام جەلال ٢٠٠٩/٥/١٣



لەگەڵ کاک مەسعود بارزانی



لەگەڵ مام جەلال، قەڵاچوالان. ٢٠٠٢



لەگەڵ مام جەلال ٢٠٠٩/٥/١٣



کۆبوونەوەی مەڵبەندی پێشمەرگە لەگەڵ بەڕیز مام جەلال، لە بەغداد.
(مام جەلال، مستەفا چاوڕەش، مەلا یاسین، ڕێزان. لای چەپ: وەستا ڕەسول، عەبدوڵڵا کانی بەردی، شاهۆ. ٢٠٠٨/١/٢٩



ئەدینو ئەفسەرێکی ئەمریکی، مەلا محرم ئیمام جومعەی مەرگە (وەفاتی کردووە) مستەفا چاوڕەش. ساڵی ٢٠٠٨ لە مەرگە



ڕانیە، لەگەڵ بەڕێز مام جەلال. هەڵبژاردنەکانی ساڵی ٢٠٠٩



لەگەڵ ماجد محەمەد ئەمینی پوورزام. ساڵی ٢٠٠٤




جەلەولا سەردانی سەنگەرەکانی پێشمەرگە. ٢٠١٤/٦/٢٨



خەدیجە حسەین ئەمین، دایکی مستەفا چاوڕەش. ١٩٨٧/١١/٢٤ شەهید بوو.




ساڵیادی دامەزراندنی یەکێتی نیشتمانی لە دوکان. لەگەڵ هەڤاڵ مام جەلال. مستەفا چاوڕەش و نەهاوەن حسەین حەسەنی هاوسەری



مستەفا چاوڕەش، زەینۆی کچی، زریانی کوڕی، نەهاوەندی هاوسەری. دابانی کوڕی




زریانی کوڕم لە
بەندینخانەی ئەمنی
عامەی بەغداد، ساڵی
١٩٨٧


الاتحاد الوطني الكردستاني
ـ الهيئة المؤسسة ـ
PATRIOTIC UNION OF KURDISTAN
١٩٧٦/١١/١٢
١٩٧٦/١١/١٢

هەڤاڵ مصطفى چاوڕەش
سڵاوێکی شۆڕشگێڕانە

داواکەی خۆت ئارەزووت دەربڕی بۆ بەشداربوون لە شۆڕش کە هەڵدەگیرسێ،
دەتانشکرد ئەوا بلیسەی شۆڕشی کورد گەڕابووە و ڕۆڵە
دڵسۆزەکانی لە هەموولایەکەوە بوون دێن و بەگەڵی ئەکەون کە
هەرکەسە بەگوێرەی توانا و شارەزایی خۆی خزمەتی ئەکات.. جاجارە دەنووسە
هاتنتان ئەکەین، هەروەها ئاگادارمان بکەنەوە ونازناوی خۆتان
بۆ بنێرە تا پلیتی خۆرەکەت بنێرین بۆ هاتنە ئێرە و لێرە شەوە بەرەو وڵات..
ئیتر بۆ ئێستا ئەوە...

**نامەی دوکتۆر فوئاد مەعسوم بۆ گەڕانەوەم لە هۆڵەنداوە**
**بۆ کوردستان و بەشداری لە شۆڕش ساڵی ١٩٧٧**



## نامەیەک بۆ دوو منداڵە خۆشەویستەکەم..

.. ئەمڕۆ (١٩٨٠/١٢/١٠) سەعات دوانزەی شەو ئاخر هەناسەمان لە پەتی سێدارە لەگەڵ دنیایەک ئاوات ئاسەدا . ئەتاسیت....

منداڵـە نازدارەکـانم ئێـستا تەمـەنم (٣٥ سـاڵە) لەسـالی (١٩٦٠)ەوە تاکو ئێستا یانی بۆ بیست ساڵ ئەچێت من لە ڕیزی جوڵانەوەی شۆڕشگێڕدا، وە بەتەحدید لە ڕێگای پیرۆزی مارکسیزم ـ لینینیزم دا تێ کۆشاوم وهەرگیز بەخیلیم نەکردووە لە پێشکەش کردنی بە نرخترین شت ئەویش کە گیانمە لە پێناوی ئەو بیرو باوەڕەپیرۆزەداو بەرزکردنەوەی ئاڵای مەزنی مارکسیزم.

خۆشەویستەکانم کـاتێ ئـەم نامەیـە ئەخوێننـەوە کـاتێکی زۆر بەسـەر چووە بەسـەر شـەهید کردنـی باوکتانـا .. نـاتوانم تقـدیری ئـەو کاتـە بکـەم بـەڵام بێگومـانم لـەوەی کـە بـۆ ئێـوەش مـەجالێکی فراوانـی تێکۆشـان و استـشهاد دەمێنێت و تا ئەوکاتەش ئێوەی خۆشەویست نایەنە سەر سفرەی حازری . بزانن لەوکاتـەوەی کـە ئێوە دروسـت بـون مـن هـەموو ئامـانجێکم ئـەوەبو کـە بەشـێوەیەکی وا پـەروەردەتان بکـەم کـە هەمیـشە ئامـادەبم بـە ووشـیاریانە بۆ تێکۆشانێکی سەخت لە پێناوی مەزن ترین چین و ڕاست ترین بیروباوەڕکە ئەوانەش چینی کرێکارو بیروباوەڕی مەزن مارکسیزم لینینیزم.

نازدارەکـانم جیـاوازی بـەینی انـسان و حـەیوان بیرکردنەوەیـە .. هـەروەك مارکس دەڵێت بیرکردنەوە زۆر پیرۆزترە لە بیرنەکردنەوە پیاوێکی چاك کە بیر ناکاتـەوە(ئـەم وتانـەی مـارکس م لێـرەدا لەبـەر نیـە بـەڵام ئـەوە نـاوەڕۆکی قسەکەیەتی)بۆیە داواتان لێ ئەکەم کە هـەمووکات هـەر بخوێننـەوەو بنوسن و بیربکەنەوە وە بڕواتان هەبێت بە بیروباوەڕی ڕاستەقینەی مارکسیزم لینینیزم.

بەلای منەوە هـەموو ڕاستیەك نسبیە تەنها بیروباوەڕی مارکسیزم کە مطلق بێت. چونکە ئەساسی بیرە گۆڕانە و تەنها لەم کەونەدا دووشت مطلقە مادەو گۆڕانی مادە وە بۆیە بیروباوەڕی مطلق چونکە لەسەر ئەو دووشتە بنیات نـراوە. خۆشەویـستی شـتێکی پـیرۆزە و پیرۆزتـرین خۆشەویـستیش خۆشەویستی کتێبە بۆیە داواتان لێ ئەکەم کە یەکەمین دیاری نازدارتان کتێب بێت دوای ئەو شتی تر.

نامەی شەوی لە سێدارەدانی بۆ

منداڵەکانی (سەنگەر و ڕۆزا)

**نامەی شەوی لە سێدارەدانی ئەکرەم مەحەمەد ئەمین بەنا بۆ منداڵەکانی (سەنگەر و ڕۆزا)**

## ڕاپۆرتی خەستەخانەی (لەندەن بریج) لەسەر ژەهرخواردکردنمان


amnesty international

INTERNATIONAL SECRETARIAT

Our reference:

Direct line:

سەرچاوەکەمان :HOR

ناوی ڕێکخراوەکە

لێبوردنی نێو دەوڵەتی — هێڵی ڕاستەوخۆ :

سکرتاریەتی نێو دەوڵەتی

ژمارە ١ ، شەقامی ئیستۆن .لەندەن.کۆدی پۆستی:WC1 8DJ

شانشینی یەکگرتوو

خانم :بریجێت کەیسی — ١٩٨٨/٢/٢٣

نەخۆشخانەی دیڤن شێر

٢٩-٣١ شەقامی دیڤن شێر

لەندن : کۆدی پۆستی WIN 1RF

بەڕێز خانم کەیس

<u>مصطفی محمود – چارەسەری سروشتی</u>

ئەم کاغەزە بۆ دووپات کردنەوەی قسەکردنەکەمانە لە ڕێی تەلەفۆنەوە کە لەم بەیانیەدا بە ئەنجامان گەیاند کەوا ئێمە پارەی تێچووی (چارەسەری سروشتی) (مصطفی محمود) دەخەینە ئەستۆی خۆمان، کەوا ڕەوانەی خەستەخانەی (دیڤن شێر) کراوە بۆ ئەم جۆرە چارەسەریە لەلایەن خەستەخانەی (لەندەن بریج)ەوە.

دڵسۆزتان

واژۆکراوە

<u>ماگی مالۆنی</u>

تەلەفۆن ٠١-٨٣٣ ١٧٧١ تێلیگرام : لێ بوردن لەندەن WC1 تێلێکس : ٢٨٥٠٢

لێ بوردنی نێو دەوڵەتی بزاڤێکی جیهانی سەربەخۆیە بێ لایەنانە کار دەکات بۆ هەموو زیندانیانی ویژدان، کە دادگایی دەستبەجێ و دادپەروەرانە بکرێن و بۆ کۆتایی پێ هێنانی ئەشکەنجەو لەناوبردن: لەلایەن چەند بەخشکارانێکەوە پارەی پێ دەدرێت کە ئەندامانی خۆیین و لایەنگرانین لە هەموو جیهاندا. پەیوەندی فەرمی هەیە لەگەڵ نەتەوە یەکگرتوەکاندا، هەروەها کانسلی ئەورووپا، ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقاو و ڕێکخراوی ولایەتەکانی ئەمریکادا.

راپۆرتی
خەستەخانەی
(لەندەن بریج)
لەسەر
ژەهرخواردکردنمان

Lewisham and
North Southwark
Health Authority

**Poisons Unit**

New Cross Hospital

21 January 1988

TO WHOM IT MAY CONCERN

This is to certify that Mr Mustafa MAHMOOD is a patient in the London Bridge Hospital, suffering from the effects of acute thallium poisoning. His medical condition is such that he will need treatment for at least one month more.

Signed ..........
J A HENRY
CONSULTANT PHYSICIAN

22 JAN 1988
TO ..........

ئارمی دەسەڵاتداری
دەسەڵاتداری تەندروستی
لویسهام و نۆرپ ساوثوەرك

یەکەی ژەهرەکان
خەستەخانەی نیوکرۆس
شەقامی ئەڤۆنلی– لەندەن
کۆدی پۆستی : SEM 5ER
تەلەفۆن :١٠-٤٠٧-٧٦٠٠
١٩٨٨/١/٢١

جی.ئێن.ڤلۆلانس
(بەکالۆریۆسی زانست لە
دکتۆری پزیشکی لە ژەهردا)
بەڕێوەبەر
جەی.ئەی هێنری (دکتۆری پزیشکی
لە بواری ژەهردا)
فیزیکی پزیشکی ڕاوێژکار
بی. ویدۆی
(بەکالۆریۆسی زانست و دکتۆرای
فەلسەفی)
ڕاوێژکاری بایۆکیمستی

بۆ هەر کەسێك ، کە مەبەست بێت

ئەم کاغەزە بۆ ئەوەیە کە شایەتی بدرێت کە بەڕێز مصطفی محمود ( وە یان موستەفا محمود) یەکێکە لە نەخۆشەکانی نەخۆشخانەی (لەندەن بریج). دەناڵێنێت بە دەست ژەهردەر خواردنی سەختی (ثالیۆم)ەوە. حاڵەتی نەخۆشیەکەی بەو جۆرەیە کە پێویستی بە چارەسەرکردن دەبێت بەلایەنی کەم بۆ یەك مانگی تر.

واژۆکراوە..........
جەی. ئەی. هێنری
فیزیکی ڕاوێژکار
(واتە دکتۆری ڕاوێژکار)

مۆر
١٩٨٨/١/٢٢
بۆ:..........
کۆپی..........

